B………………………………………………………………………………

هەرچەن مەواچان فارسی شەکەرەن

کوردی جە لای من بەس شیرینتەرەن

پەی چێش نەدەوران ئەی دونیای بەدکێش

مەحزووزەن هەرکەس بە زەبانێ وێش

مەعلوومەن هەرکەس بەهەر زەبانێ

بواچۆ نەزمێ جە هەر مەکانێ

جە لای خرەدمەند دڵپەسەند مەبۆ

شیرینتر جە شەهد شیرەی قەند مەبۆ

((خانای قوبادی ))

C.....................................................................................................

# نەتەوە

سەرەکیترین پێناسەی مرۆڤە و

# زمان

گرینگترین ناسنامەی نەتەوەیە

D..............................................................................................

ناوی کتێب:

ئەلفوبێ و ڕێنووسی زمانی یەکگرتووی کوردی

**************************

نووسینی:

ئارام ساڵحی

**************************

چاپ:

چوارەم ، زستانی ٢٧١٢ی کوردی ، مەریوان

**************************

بۆ پۆلە فێرکارییەکانی

ئەنجومەنی فەرهەنگی _ ئەدەبیی مەریوان

aramsalehi@yahoo.com

E...........................................................................................

(( به نێوی خولقێنەری تاک ))

**ناوەڕۆک ............................................................ لاپەڕە**

## ١-١. ئەلفوبێی زمانی یەکگرتووی کوردی

ئـــەلفوبێی زمـــانی یـــەکگرتووی کـــوردی کـــە لەســـەر بنـــەمای زاراوەی کرمانجیی خواروو(سۆرانی) دانراوە،٣٧ دەنگی لەخۆوە گرتووە. بۆ نووسینی ئەم دەنگانە، لە ئەلفوبێی ئارامیدا (عەرەبی)٣٤ پیت تەرخان کراوە بەم شێوەیە:

**ئ ، ا ، ب ، پ ، ت ، ج ، چ ، ح ، خ ، د ، ر ، ڕ ، ز ، ژ ، س ،ش ، ع ، غ ، ف ، ڤ ، ق ، ک ، گ ، ل ، ڵ ، م ، ن ، و ، ۆ ، وو ، هـ، ە ،ی ، ێ .**

**سەرنج:** لێرەدا ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێت کە سێ دەنگ لە نێو ئەم ئەلفوبێیەدا بەرچاو ناکەون کە ئەبێت سەرنجی ئەم تێبینییە بدەن:

**١. پیتی "ی"** بۆ دوو دەنگی"ی"(بزوێن)+"ی"(نەبزوێن) کەڵکی لێ دەگیردرێت.

**٢. پیتی "و"** بۆ دوو دەنگی "و"(بزوێن)+"و"(نەبزوێن) کەڵکی لێ دەگیردرێت.

**٣.** لەنێو ٣٧ دەنگەکەدا بزوێنێک هەیە بە ناوی **"بزرۆکە"** کە پیتی بۆ دیاری نەکراوە و نانووسرێت.

## ١-٢. دابەشکردنی دەنگەکان یان پیتەکان

**دەنگەکان چۆن بەدی دێن؟**

لە هەڵکەوتنی هەوای هەناسەدانەوە لە ئەندامانی ئاخاوتنی ناو گەروو تا لێوەکان (ژێ دەنگییەکان ، زمان ، دیان ، لێو ، ئووک و ...) دەنگەکان بەدی دێن.

ئـەم دەنگانـە بـە پێـی ئـەوەی کـە هـەوای هـەناسـەدانەوە لـە چ ئەنـدامێک هەڵبکـەوێت دابـەش دەکـرێن بەسـەر دوو بەشـدا:

## ١) بزوێنەکان(دەنگـدارەکان):

ئـەم دەنگانـە لـە هەڵکـەوتنی هـەوای هەناسـەدانەوە لـە ژێ دەنگییـەکان بـەدی دێـن و بێ ڕاوەسـتان، ڕاستەوخۆ لـە گـەروو تـا دەم دێنـە دەرەوە و لەکاتی دەربڕینیاندا دەم کراوە دەمێنێتـەوە ، کـە بـریتین لـەم ٨ دەنگـە:

**ە ، ێ ، ۆ ، ا ، ی ، وو ، و ، "بزرۆکـــــە" .**

## ٢) نەبزوێنەکان(بێدەنگـەکان):

ئەم دەنگانە بە هۆی هەڵکەوتنی هەوای هەناسەدانەوە لە ژێ دەنگییەکان و ئەندامانی تری ئاخاوتن بەدی دێن و بەر لەوەی کە ڕاستەوخۆ لە دەم بێنە دەر ، ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت و لە کاتی دەربڕینی هەندێکیشیان دەم بە بەستراوەیی دەمێنێتەوە ، کە بریتین لەم ٢٩ دەنگە:

**ئ، ب ، پ ، ت ، ج ، چ ، ح ، خ ، د ، ر ، ڕ ، ز ، ژ ، س ،ش، ع ، غ ، ف ، ڤ ، ق ، ک ، گ ، ل ، ڵ ، م ، ن ، و ، هـ ، ی .**

**چەن سەرنجێک لەسەر بزوێنەکان و نەبزوێنەکان:**

١) ڕێژەی نەبزوێنەکان لە ئەلفوبێدا زۆرترە لە بزوێنـەکان.

٢) بـە شـێوەی نووسـینی دەنگـەکان "**پیـت**" دەوترێـت.

٣) کاتێـک دەمانـەوێ بزوێنـەکـان بـە تـاک دەربـڕین لـە پیتـی نەبزوێنی"ئـ" کەڵک دەگرین ، وەکوو : ئە ، ئێ ، ئۆ ، ئا ، ئی ...

٤) کاتێـک دەمانـەوێ پیتـە نەبزوێنـەکان بـە تـاک دەربـڕین لـە بزوێنـی "ێ" کەڵک دەگرین ، وەکوو: بێ ، پێ ، تێ ، سێ ، جێ ... .

## ٣-١. ڕێنووس و شرۆڤەی بزوێنەکان (پیتە دەنگدارەکان)

### ١) ە ، ـە :

هەمبەری دەنگی ئەم پیتە لە زمانی فارسیدا دەنگی "سەرە یان فەتحە"یە کە بە شێوەی ـَـ دەینووسن ، وەکوو : بَرهَم = بەرهەم .

وێنە: سەردەم ، دەگمەن ، تەوەرە ، بیرەوەری، یانە.

### ٢) ێ ـێ ـێ ێ :

هەمبەری دەنگی ئەم پیتە لە زمانی فارسیدا دەنگی "ژێرە یان کەسرە"یە کە بە شێوەی ـِـ دەینووسن ، وەکوو : پَراوِز= پەراوێز.

وێنە: هێما ، نێوان ، هێدی ، هێور ، سێ (٣) .

### ٣) ۆ ، ـۆ :

لە ئەلفوبێدا ئەم پیتە پێی دەڵێن "واوی کراوە" ، هەمبەری دەنگی ئەم پیتە لە زمانی فارسیدا دەنگی "بۆرە یان زەممە"یە کە بە شێوەی و دەینووسن، وەکوو: هُزان = هۆزان . وێنە : جۆزەردان ، مەکۆ ، سەربەخۆ ، ئارۆ .

**سەرنج:**١) لە هەندێ وشەی زمانی فارسیدا دەنگی "ۆ" بە شێوەی "بۆرە" ناینووسن بەڵکوو بە پیتی "و" دەینووسن ، وەکوو ئەم وشەگەلە : تو ، خوراک ، خوردن .

٢) ئەم سێ پیتە کە خوێندمان : ە ، ێ ، ۆ ، لە ئەلفوبێی زمانی کوردیدا وەکوو سێ پیت ئەژمار دەکرێن بەڵام لە ئەلفوبێی زمانی فارسیدا وەکوو پیت ئەژمار ناکرێن و پێیان دەوترێت: "حرکات سەگانە" .

## ٤) ا ، ـا :

خەرمانان ، تاوان ، هاوار ، بەفرانبار ، تاراوگە ، هەورامان .

## ٥) یـ ـیـ ـی ی :

دیمەن ، بیرمەند ، تێبینی ، هیوا ، وەزی ، سی (٣٠) .

**سەرنج:** ئەم پیتە لە ئەلفوبێی ئارامیی زمانی کوردیدا بۆ دوو دەنگی جیاواز کەڵکی لێ دەگیردرێت: ی= ئی(دەنگدار) ، ی= یێ(بێدەنگ)، بەڵام تا ئێستا لە نووسیندا لەیەک جیا نەکراونەتەوە. بۆ باشتر ناسینی ئەم دوو دەنگە سەرنجی بەشی برِگە بدەن.

## ٦) وو ، ـوو :

لە ئەلفوبێدا ئەم پیتە پێی دەڵێن "واوی درێژ یان کێشراو" کە لە زمانی فارسیدا بە پیتی "و" دەینووسن ، وەکوو : هَنوکَ = هەنووکە .

وێنە : هاروو ، سووتەمەنی ، باکوور ، پێنووس ، براڵوو .

**سەرنج:** ئەم ٦ بزوێنە کە خوێندمان دەنگەکانیان لە نێوان دوو زمانی کوردی و فارسیدا هاوبەش بوون ، بەڵام ئەو دوو بزوێنەی خوارەوە دەنگەکانیان تایبەتە بە زمانی کوردی و لە زمانی فارسیدا بەدی ناکرێن.

## ٧) و ، ـو :

لـه ئەلفوبێـدا ئـەم پیتـە پێـی دەڵـێن "واوی کـوردی یـان کـورت" ، شـێوەی دەربڕین یان دەنگی ئەم پیتە تایبەتە بە زمانی کوردی و لە زمانی فارسیدا بــەدی ناکرێــت . وێنــە : کــورد ، ســوکنایی ، هونــەر ، خودموختــار .

**سەرنج :** ١) هەروەها کە خوێندمان لە نێو پیتە بزوێنەکاندا پیتی"و" بە سێ شێوە و بۆ سێ دەنگی تایبەت کەڵکی لێ دەگیردرێت: ۆ(ئۆ) ، وو(ئوو) ، و(ئـو) ، دەنگـی "و" دەکەوێتــە نێــوان دوو دەنگــی "ۆ" لەگــەل "وو" واتــە درێژتــر لــە "ۆ" و کــورتتر لــە "وو" . بــۆ لێکدانــەوە و باشــتر تێگەیشــتن لـە دەنگی ئـەم سێ پیتـە لـە یـەکتر سـەرنجی دەربڕینـی ئـەم وشـەگەلە بدەن: **کۆڕ(جلسە) ، کوڕ(پسر) ، کووڕ(خمیـدە).**

٢) هــەر وەکــوو پیتــی "ی" ، هــەروەها پیتــی "و" لــە ئــەلفوبێی زمــانی کوردیــدا وەک دوو پیــت دێتــە ئــەژمار ، بــۆ ئــەوەی بــە شــێوەی بـزوێن و نـەبزوێن چـاوی لـێ دەکرێـت ، بـەڵام تـا ئێسـتا لـە نووسـیندا لەیــەک جیــا نەکراونەتــەوە. بــۆ باشــتر ناســینی ئــەم دوو دەنگــە سەرنجی بەشی بڕگە بدەن.

## ٨) دەنگی "بزرۆکە" :

لــە وشــەی "کوردســتان" ، لــە دوای پیتــی "د" دەنگێکــی زۆر کــورت دەردەبڕدرێـت کـە ئـەو دەنـگە پێـی دەوترێـت بزرۆکـە، دەربڕینەکـەی تـا ڕادەیێـک وەکوو دەربڕینی ژێرەیێکی (ێ) زۆر زۆر کورتـە . دەنگی بزرۆکـە وەکـوو دەنگی "و"(واوی کـوردی) تایبەتـە بـە زمـانی کـوردی . ئەمـە تاکـە

دەنگێکە کە لە ئەلفوبێی کوردیی ئارامیدا نانووسرێت و پیتی تایبەتی بۆ دیاری نەکراوە. بەڵام لە ئەلفوبێی کوردیی لاتیندا بەم پیتە دەینووسن: i .
هەروەها لەم چەن وشەیەدا « هێمن ، هێور ، سەندن » لە بڕگەی دووهەمیاندا لە دوای پیتەکانی "م ، و ، د" دەنگی بزرۆکە دەردەبڕدرێت.
بۆ باشتر تێگەیشتن لە دەنگی "بزرۆکە" سەرنجی بەشی بڕگە بدەن .

## ٤-١. ڕێنووس و شرۆڤەی نەبزوێنەکان( پیتە بێدەنگەکان)

### ١) ئ :

ئەم پیتە لە زمانی فارسی و عەرەبیدا پێی دەڵێن "هەمزە".
وێنە : ئاکار ، ئیلام ، ئەسمەر ، ئینە .

### چەن سەرنجێک لەسەر پیتی " ئـ ":

١) لە هەندێ وشەی زمانی فارسیدا پیتی" ئـ " هەر بەو جۆرە دەینووسن و لە هەندێ وشەی تردا بە شێوەی " ا " دەینووسنەوە ، وەکوو:« ایمان ، اصفهان » .

٢) زۆربەی ئەو وشەگەلەی کە ئەم پیتەیان تێدایە وشەی عەرەبین .

٣) لە وشەکانی زمانی کوردیدا پیتی" ئـ " لە سەرەتا و نێوان وشەدا دەبینرێت، بەڵام لە کۆتاییی وشەدا زۆر زۆر بەدەگمەن بەدی دەکرێت. بۆ وێنە لە وشەی "نە"، ئەگەر بە شێوەی جەخت(تەئکید) دەرببڕێت و بوترێت ، دەبێت بە شێوەی "ء" بنووسرێت : نەء . دەبێت ئەوەش بزانین کە لە هەندێ ناوچەدا بەجێگەی "نەء" دەڵێن "هەء" . هەروەها ئەگەر لە وشەی عەرەبیدا ئەم پیتە لە کۆتاییدا هات ، دەبێت بە ڕێنووسی کوردی بنووسرێتەوە، وەکوو: مَبدَأ = مەبدەء ، مَنشَأ = مەنشەء .

٤) شـێوەی نووسـینی پیتـی "ئـ" لەگـەڵ دوو بزوێنـی "واوی کـوردی" و دەنگی "بزرۆکە" لـە وشـەدا :

ئـ + و ، وەکوو : ئومێد ، ئوستاد ، ئوستان .

ئـ + بزرۆکە ، وەکوو : ئستران ، ئشکێل ، ئستاندارد ، ئسپانیا

٥)ڕێنووسی پیتی "ئـ" لەگەڵ ٦ پیتی بزوێنی هاوبەش لە دوو زمانی کوردی و فارسیدا:

| پیتی ئـ + پیتە بزوێنەکان | | وێنە | |
|---|---|---|---|
| **کوردی** | **فارسی** | **کوردی** | **فارسی** |
| **ئـ + ە** | **اَ** | ئەهوەن | اَهوَن |
| **ئـ + ێ** | **اِ** | ئێوارە | اِوارَ |
| **ئـ + ۆ** | **اُ** | ئۆقرە | اُقرَ |
| **ئـ + ا** | **آ** | ئامانج | آمانج |
| **ئـ + ی** | **ایـ** | ئیلیان | ایلیان |
| **ئـ + وو** | **او** | ئووک | اوك |

**٢) ب :**

بەرخۆدان ، بووژاندنەوە ، بێریتان ، بانگەواز ، بلیمەت ، بێساران .

**٣) پ :**

پەرەسەندن ، پشكۆ ، پەرەسێلكە ، پارێزەر ، ئاپۆرە ، پاوە .

**٤) ت :**

تارا ، تاسە ، تەمەن ، تێڕوانین ، تامەزرۆ ، مەتەرێز ، تاتە .

**سەرنج :** لە ڕێنووسی زمانی كوردیدا پیتی "ط" نانووسرێت ، بۆیە ئەو وشانەی ئەو پیتەیان تێدایە وشەی عەرەبین كە دەبێت هەر بە شێوەی پیتی"ت" بنووسرێنەوە . وەكوو: عَطر=عەتر، طَلاق= تەڵاق، اَطلَس= ئەتڵەس .

**٥) ج :**

جەمسەر ، جووڵانەوە ، جەماوەر ، جێژوان ، هەجیج .

**٦) چ :**

چوارچرا ، چۆمان ، چاویلكە ، چاودێر ، چیا .

**٧) ح :**

حەسانەوە ، حەشارگە ، حەیران، مەحوی ، حەپەساو .

**٨) خ :**

خەبات، خوێندكار، خۆرهەڵات، خەسارناسی، مەخابن.

## ٩) د :

داسەپاندن ، دڵـۆپ ، دووپـات ، دیاردە ، نۆدشـە .

## ١٠) ر ، ١١) ڕ :

دەربڕینـی پیتـی "ر" سـووک و لاوازە ، بـەڵام دەربڕینـی پیتـی "ڕ" قـورس و قەڵەوە، وێنە : **"ر"ێی سووک:** هەرا مەکە ، برین ، گۆران ، درا، بـرۆ، چـرا .

**"ڕ"ێی قـورس:** هـەڕا مەکـە ، بڕین ، گۆڕان ، دڕا ، بـڕۆ ، چـڕا .

**سەرنج :** ئەم دوو پیتە لە دەربڕیندا جیاواز و سەربەخۆن بۆیە باشتر وایـە لـە نووسینیشدا جیاوازی و سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن ، بـەم بۆنـەوە پیتـی "ڕ" لـە هەر شوێنێکی وشەدا ( سەرەتا ، ناوەند ، کۆتایی ) ببینرێت، بۆ ئەوەی دەربـڕین و واتای وشەکە بەدرووستی بێتە دی دەبێت هـەمووکات ئـەم نیشانەیەی " ٧ " بۆ دابنرێت .

## ١٢) ز :

زیرەڤان ، زیز ، زانا ، زریکە ، زانست ، زارۆ .

**سەرنج :** ئەو وشـەگەلەی کە بە پیتەکانی " ذ ، ض ، ظ " نووسراون وشـەی عەرەبین کە دەبێت لە ڕێنووسی کوردیدا هەر بە شێوەی پیتی "ز" بنووسرێنەوە، وەکوو: مَذهَب = مەزهەب، قاضی= قازی، مَظهَر= مەزهەر .

## ١٣) ژ :

ژیلەمۆ ، ژاکاو ، ژینەر ، ژوانگە ، ژیلوان ، مەژگە .

**١٤) س :**

سەربەست ، سەما ، سەردەم ، سێدارە ، سەرۆک ، ئاپاسە .

**سەرنج :** ئەو وشەگەلەی کە بە پیتەکانی "ث ، ص" نووسراون وشەی عەرەبین کە دەبێت لە ڕێنووسی کوردیدا هەر بە شێوەی پیتی "س"بنووسرێنەوە ، وەکوو: ثَروَت = سەروەت ، صادرات = سادرات .

**١٥) ش :**

شەتاو ، شایان ، شەنگەبێری ، شەڕخواز ، شنە ، شاهۆ .

**١٦) ع :**

عەودالْ ، عازەب ، عەربەت ، عەنکاوە .

**١٧) غ :**

غەم ، غونچە ، غەزەڵ ، غەدار ، قەڵغان .

**١٨) ف :**

فڕۆکە، فڕوفێڵ ، فێنک ، فرمێسک ، فێرگە .

**١٩) ڤ :**

تاڤگە ، نێچیرڤان ، ڤیان ، گۆڤار ، هەڤاڵ .

**سەرنج :** ١) دەنگی ئەم پیتە لە زمانی فارسیشدا هەیە بەڵام وەکوو پیتێکی سەربەخۆ ئەژمار ناکرێت و ناچێتە ناو لیستی ئەلفوبێی فارسییەوە ، وەکوو دوو وشەی: اوّل ، دوّم .

٢) دەنگی "ڤ" وەکوو دەنگی ئەم پیتەیە لە ئینگلیسیدا : « v » ، وەکوو وشەی : love (لاڤ) .

## ٢٠) ق :

قـازانـج ، قـاڵاو ، قـوژبـن ، قـامیشـەڵان ، تـەقینـەوە .

## ٢١) ک :

کـاردانـەوە ، کـەرەستـە ، کـازیوە ، نـاوەڕۆک ، کناچێ .

## ٢٢) گ :

گەل ، گزینگ ، گازنـدە ، گاڵتـە ، گرینگ ، شەوەزەنگ .

## ٢٣) ل ، ٢٤) ڵ :

هەر وەکوو دوو پیتی "ر" و "ڕ" دەربڕینی پیتی "ل" سووک و لاوازە ، بەڵام دەربڕینی پیتی" ڵ" قورس و قەڵەوە. وێنە: **"ل"ێی سووک:** گول ، کەل ، کول ، گەلاوێژ ، جوولەکە ، چل(٤٠). **"ڵ"ێی قورس:** گوڵ ، کەڵ ، کوڵ، گەڵاڕێزان ، جووڵە ، چڵ . **سەرنج:** لە نێو پیتەکانی ئەلفوبێی زمانی کوردیدا هەر ئەو چوار پیتەی کە تا ئێرە خوێندمان ئەم نیشانەیە "٧" دەگرن، کە بریتی بوون لە : ێ ، ۆ ، ڕ ، ڵ.

## ٢٥) م :

مامز ، ماف ، مەهاباد ، مرۆڤ ، لەمپەر ، شەمامە ، مەتی .

**٢٦) ن :**

ناوبانگ ، ناوبژی ، نەتەوە ، نەریت ، هەناو ، مانیای .

**٢٧) و :**

لە ڕێنووسی زمانی کوردیدا ئەم پیتە بۆ دوو دەنگی "واوی کوردی "(حەوتەمین پیتی بزوێن) و "واوی نەبزوێن" کەڵکی لێدەگیردرێت ، کە لە ڕوانگەی فۆنۆتیکەوە دوو دەنگی جیاوازن ، بەڵام شێوەی نووسینیان جیا نەکراوەتەوە . وێنە بۆ پیتی نەبزوێنی "و" : وەرە ، وەرز ، هەوار ، هەورام. بۆ باشتر لێکدانەوەی ئەم دوو پیتە لە یەکتر بڕواننە بەشی بڕگە .

**٢٨) هـ :**

هێشوو ، هانا ، هۆگر ، هۆز ، لێهاتوو، هەرمان .

**سەرنج:** ئەم پیتە زۆر زۆر بە دەگمەن لە زمانی کوردیدا لە کۆتاییدا دێت بەڵام لە وشەی عەرەبی و فارسیدا لە کۆتاییشدا بەدی دەکرێت ، کە دەبێت هەربەو شێوەی سەرەوە بنووسرێتەوە ، وەکوو :

تەشبیهـ ، ئاهـ ، بەهـ بەهـ ، ماهـ .

**٢٩) ی :**

هەر وەکوو پیتی "و" ، لە ڕێنووسی زمانی کوردیدا ئەم پیتە بۆ دوو دەنگی ئـ"ی" (پێنجەمین پیتی بزوێن) و پیتی "ی"ی نەبزوێن کەڵکی لێ دەگیردرێت ، کە لە ڕوانگەی فۆنۆتیکەوە دوو دەنگی جیاوازن ، بەڵام شێوەی نووسینیان جیا نەکراوەتەوە . وێنە بۆ پیتی نەبزوێنی "ی" : یاسا ،

یارسان ، کایە . بۆ باشتر تێگەیشتن و لێکدانەوەی ئەم دوو پیتە لە یەکتر بڕواننە بەشی بڕگە.

## ١-۵. هەڵسەنگاندنی پیتەکان لە دوو زمانی کوردی و فارسیدا

**سەرنج:** ژمارەی پیتەکان لە دوو زمانی کوردی و فارسیدا جیاوازن لە یەکتر، ئەوەی کە لێرەدا باسی لێوە کراوە تەنیا هەڵسەنگاندنی پیتەکانە لە دوو بواری ڕێنووس و دەربڕین لە کوردی و فارسیدا:

١) ئەو پیتانەی کە ڕێنووس و دەربڕینیان لە هەر دوو زمانی کوردی و فارسیدا جیاوازیی نییە : **ئـ ، ا ، ب ، پ ، ت ، ج ، چ ، ح ، خ ، د ، ر ، ز ، ژ ، س ، ش ، ع ، غ ، ف ، ق ، ک ، گ ، ل ، م ، ن ، و(نەبزوێن)، هـ ، ی(بزوێن و نەبزوێن).**

٢) ئەو پیتانەی کە ڕێنووسیان تایبەتە بە زمانی کوردی: **ڕ، ڵ، ڤ، وو، ۆ، ێ.**

٣) ئەو دەنگانەی کە تایبەتن بە زمانی کوردی: **بزرۆکە ، بزوێنی "و" .**

۴) تاکە پیتی "ە ، ـە" : ئەم پیتە شێوەی نووسینی لە دوو زمانی کوردی و فارسیدا هاوبەشە . لە زمانی کوردیدا وەکوو دەنگی "سەرە یان فەتحە" دەردەبڕدرێت بەڵام لە زمانی فارسیدا هەر وەکوو پیتی "هـ".

## ٦-١. ڕێنووسی کوردیی هەندێ پیت و هێمای زمانی عەرەبی

| ڕێنووس | | وێنە | |
|---|---|---|---|
| عەرەبی | کوردی | عەرەبی | کوردی |
| أ | ئـ | تَأليف | تەئلیف |
| ؤ | ئـ | مَسؤل | مەسئوول |
| ة | ت | صَلاة | سەلات |
| اً | ن | حَتمَاً | حەتمەن |
| تشدید | دووپات کردنەوەی | مُحَمَّد | موحەممەد |
| ىٰ | ا | موسىٰ | مووسا |

### دوو سەرنج لەسەر گیرە(تشدید):

١) لە هەندێ وشەدا کە عەرەبی نین "گیرە"هەیە ، وەکوو ئەم وشەگەلە:
شەممە ، بقّە ، گوللە و .

٢) ئەو وشە عەرەبییانە کە هێمای گیرەیان تێدایە لە ڕێنووسە کوردییەکەیاندا دەیشکرێت پیتی گیرەدار بە یەک جار بنووسرێتەوە .

## ٧-١. ڕێنووسی کوردیی هەندێ وشەی عەرەبی

لە زمانی کوردیدا وشەکان هەرچۆنێ کە دەبێژرێن هەر بەو شێوەیە دەنووسرێنەوە ، بەتایبەت وشەی دەرەکی وەکوو ئەم وشە عەرەبییانە :

| وشەی عەرەبی | ڕێنووسی کوردی |
|---|---|
| عَبدُالكَريم | عەبدولکەریم |
| عَبدُالوَهاب | عەبدولوەهاب |
| عَبدُالرَّحمان | عەبدولڕەحمان |
| عِزَت الدّين | عێزەدین |
| نَجمَ الدّين | نەجمەددین |
| صَلاحَ الدّين | سەلاحەددین |
| لُطفُ الله | لوتفوڵڵا |
| كَليمُ الله | کەلیموڵڵا |

## ٨-١. ناسینی دەنگێکی تایبەت لە هەندێ وشەی کوردیدا

لە هەندێ وشەی زاراوەکانی زمانی کوردیدا هەندێ دەنگ دەبیـژرێن کە ئەو دەنگانـە بـەپێی زانسـتی ئاواناسـی(فۆنێتیک) ناچنـە سـەر پیتـەکان و کـەوابوو ناشنووسرێن. یەکێک لەو دەنگانە کە زۆرتر لەنێو وشەکاندا دەبینرێت دەنگێکە کە لەسەر دوو پیتی "نگ" لەم وشەگەلەدا دەبێژرێت ، وەکوو : مانگ، هـەنگ ، دەنگ ، هەنگاو ، بانگ ، هەنگوێن ، شنگ ، ڕەنـگ . هـەروەها لـەم وشـەگەلەی خوارەوەشدا لە سەر پیتی "ن" ئەم دەنگە هەیە، وەکوو : یانزە ، دوانزە ، سیانزە ، پـانزە ، شـانزە ، بێنـز ، بـەنزین ، لیسـانس ، کـونفرانس ، سـانس ، شـانس ، فەرانسە ، و . . . .

**سەرنج :** لێرەدا دەبێت ئەوە لەبەرچاو بگرین کە بۆ نووسینی ئەو دەنگانە پێویست ناکات شێوەی نووسین یان پیتێک دیاری بکرێن و دەبێت هەر بەو شێوەی سەرەوە بنووسرێن .

## ١-٢. پێناسەی بڕگە

هەر بڕگەیێک بریتییە لە دوو تا چەن دەنگ یان پیت کە دوابەدوای یەک و بەبێ ڕاوەستان لە یەکجار هەناسەدانەوە دەردەبڕدرێت .

## ٢-٢. پێکهاتەی بڕگە لە وشەدا

١. هەر وشەیێک دابەش دەکرێت بە سەر یەک یان چەن بڕگەدا .

٢. هەر بڕگەیێک بریتییە لە یەک بزوێن (پیتی دەنگدار) و یەک یان چەن نەبزوێن(پیتی بێدەنگ).

٣. بزوێن لە سەرەتای وشە و بڕگەدا جێناگرێت.

٤. بزوێن دووهەمین پیتی بڕگەیە.

٥. لە وشە یان بڕگەدا دوو بزوێن لە لای یەک نانووسرێن.

## ٣-٢. پێکهاتە و داڕشتنی پیتی بزوێن و نەبزوێن لە بڕگە و وشەدا

بڕگە لە زمانی کوردیدا دابەش دەکرێت بەسەر ئەم چوار پێکهاتەیەدا:

١. نەبزوێن + بزوێن ، وەکوو : نە ، سێ ، نۆ ، با ، چی ، دوو .

٢. نەبزوێن + بزوێن + نەبزوێن ، وەکوو : دەم ، سێف ، خۆر ، دار.

٣. نەبزوێن + بزوێن + نەبزوێن + نەبزوێن ، وەکوو: کورد ، مەرگ ، مانگ.

٤. نەبزوێن+ بزوێن+ نەبزوێن+ نەبزوێن+ نەبزوێن ، وەکوو: گەیشت، ڕۆیشت.

## ٤-٢. وێنەی دیاریکردنی بڕگەکان لە وشەدا

**١. "ڕۆژهەڵات" :** دابەش دەکرێت بە سەر سێ بڕگەدا :

ڕۆژ = نەبزوێن ، بزوێن ، نەبزوێن

هە = نەبزوێن ، بزوێن

ڵات = نەبزوێن ، بزوێن ، نەبزوێن

**٢. "کوردستان" :** دابەش دەکرێت بە سەر سێ بڕگەدا :

کور = نەبزوێن ، بزوێن ، نەبزوێن

دس = نەبزوێن ، بزوێن(بزرۆکە) ، نەبزوێن

تان = نەبزوێن ، بزوێن ، نەبزوێن

**٣. "کرماشان" :** دابەش دەکرێت بە سەر سێ بڕگەدا :

کر = نەبزوێن ، بزوێن(بزرۆکە)، نەبزوێن

ما = نەبزوێن ، بزوێن

شان = نەبزوێن ، بزوێن ، نەبزوێن

**٤. "نیشتمانم" :** دابەش دەکرێت بە سەر چوار بڕگەدا :

نیش = نەبزوێن ، بزوێن ، نەبزوێن

ت = نەبزوێن ، بزوێن(بزرۆکە)

ما = نەبزوێن ، بزوێن

نم = نەبزوێن ، بزوێن(بزرۆکە) ، نەبزوێن

## ٢-٥. شێوەی ناسینەوە و لێکدانەوەی ئەم دەنگانە لە یەکتر: "و" «بزوێن و نەبزوێن» // "ی" «بزوێن و نەبزوێن»

بەپێی پێکهاتەی برگە ، دوو پیتی "و ، ی" تەنیا لەم شوێنانەدا دەچنە سەر نەبزوێنەکان:

١. لە سەرەتای وشەدا ، وەکوو : وەرە ، یاگە .

٢. لە سەرەتای برگەدا ، وەکوو : هەوار ، ئەیا .

٣. لە دوای بزوێنەکان ، وەکوو : باوک ، دایک .

## ٢-٦. شێوەی ناسینەوە و دیاریکردنی دەنگی "بزرۆکە" لە وشەدا

بە سەرنجدان بە پێکهاتەی برگە ، هەرکات لە برگەیێکدا هەموو پیتەکانی نەبزوێن بوون و لەم حەوت پیتە بزوێنە « ە ، ێ ، ۆ ، ا ، ی ، وو ، و » هیچیان نەبینران ، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو برگەیە دەنگی بزرۆکەی تێدایە ، وەکوو ئەم وشانەی خوارەوە:

گرتن = گر ( نەبزوێن + بزرۆکە + نەبزوێن)

تن ( نەبزوێن + بزرۆکە + نەبزوێن )

مردن = مر ( نەبزوێن + بزرۆکە + نەبزوێن )

دن ( نەبزوێن + بزرۆکە نەبزوێن)

سنە = سـ ( نەبزوێن + بزرۆکە)

نە ( نەبزوێن + بزوێن)

## ٧-٢ . پێکهاتەی نووسینی پیتەکان پێکەوە لە وشە و بڕگەدا

١) پیتی " ڵ "ی قورس لە تەواویی زاراوەکاندا لە سەرەتای وشەدا نابینرێت.

٢) پیتی "ڕ"ی سووک تەنیا لە زاراوەی کرمانجیی ژووروودا لە سەرەتای وشەدادێت.

٣) جگە لەو دوو دۆخەی سەرەوە تەواویی پیتە نەبزوێنەکان لە سەرەتا و نێوان و کۆتاییی وشە و بڕگەدا دێن.

٤) پیتە بزوێنەکان لە سەرەتای وشە و بڕگەدا بەدی ناکرێن، بەڵکوو لە نێوان و کۆتاییی وشەدا دێن.

٥) پیتی بزوێنی "و" لەگەل بزوێنی "بزرۆکە" لە کۆتاییی وشەدا زۆر بە دەگمەن بەدی دەکرێن .

# بەشی ٣ :

# بابەتەکانی
# وانەی
# زمانی کوردی

دەق ، شێعر ، ژیاننامەی شاعیران

بۆ ڕاهێنانی خوێندن و نووسینی زمانی کوردی

وانەی یەکەم



## عەبدوڵڵا پەشێو

ساڵی ١٩٤٥ی زایینی لە گوندی بێرکوت لە ناوچەی شاری هەولێر لەدایک بووە. وەکوو زۆربەی ڕووناکبیرە کوردەکان ژیانی تاراوگە و دووریی وڵات دەبێتە بەشی و تا ساڵی ١٩٧٠ی زایینی لە وڵاتانی ڕووسیا ، لیبیا و سویس ژیاوە . پەشێو دوکتورای زمان و وێژەی کوردیی لە زانستگەی مۆسکۆ وەرگرتووە . هەروەها لە وڵاتانی ڕووسیا و لیبیا مامۆستای زانستگە بووە . ناوەڕۆکی زۆربەی شێعرەکانی ڕەنگدانەوەی هەست و خۆشەویستییە بۆ نیشتمان.

**هەندێک لە بەرهەمەکانی بریتین لەمانە :**

١) فرمێسک و زام ، (١٩٦٥-١٩٦٧)

٢) بتی شکای ، (١٩٦٨)

٣) شەونامەی شاعیرێکی تینوو ، (١٩٧٢)

٤) دوانزە وانە بۆ منداڵان ، (١٩٧٧)

٥) شەو نییە خەوتان پێوە نەبینم ، (١٩٨٠)

٦) برووسکە چاندن ، (١٩٨٠-١٩٨٨)

٧) دیوانی براکوژی ، (١٩٩٤)

٨) بەرەو زەردەپەڕ ، (٢٠٠١)

٩) پرێسکی عاشقێکی زگماک ، (٢٠٠٦)

## سەربازی ون

کە وەفدێ دەچێتە شوێنێ
بۆ سەر گۆڕی سەربازی ون
تاجە گوڵینەیێک دێنی
ئەگەر سبەی وەفدێ بێتە وڵاتی من
لێم بپرسێ کوانێ گۆڕی سەربازی ون
دەڵێم گەورەم
لە کەناری هەر جۆگەیێ
لە سەر سەکۆی هەر مزگەوتێ
لە بەر دەرگای هەر ماڵێ ،
هەر کەنیسەیێ ، هەر ئەشکەوتێ
لە سەر گابەردی هەر شاخێ
لە سەر درەختی هەر باخێ
لەم وڵاتە
لە سەر هەر بستە زەمینێ
لە ژێر هەر گەزە ئاسمانێ
مەترسە
کەمێک سەرت داخە و
تاجە گوڵینەکەت دانێ!

وانەی دووهەم

## گرینگیی زمان

لە نێو پێناسە و ناسنامەگەلی نەتەوەکان وەکوو: مێژوو ، وڵات ، فەرهەنگ ، زمان و ... بە پێی زانستە جۆراوجۆرەکان و وتەی زانایان و بیرمەندان ، زمان گرینگترین و سەرەکیترین ناسنامەی نەتەوە و مرۆڤە. زمان ئامرازێکە بۆ ئاخافتن و گۆڕاندنەوەی بیروبۆچوونەکان و هەروەها پێوەندیگرتنی مرۆڤەکان پێکەوە . ئەگەر مرۆڤ ژیانی تاکەکەسیی دەبوو دڵنیا بووین کە پێویستیی بە زمان نەدەبوو و زمان بەدی نەدەهات. پێویستیی مرۆڤەکان بەبێ زمان بەڕێوە ناچێت، کۆمەڵگاکان بە هۆی زمانەوە پێش دەکەون . پێوەندیی کۆمەڵایەتی و نێوگەلانیش بە یارمەتیی زمان پێک دێت ، شارستانییەت بەبێ زمان بەرەو پێش ناچێت ، بەم بۆنەوەیە کە دەڵێن زمان دیاردەیێکی کۆمەڵایەتییە. زانایان و بیرمەندان لە سەر زمان وتەی زۆر بەنرخیان نووسیوە کە دەتوانین ئاماژە بەم کەسانە بکەین : نووام چامسکی زمانناسی گەورەی ئەمریکی دەڵێت : جیاوازیی مرۆڤ لە گیانلەبەرانی تر لە بەکاربردنی زمانە وەکوو ڕێسایێکی پێوەندیدار. هێگێل فەیلەسووفی بەناوبانگ دەڵێت : زمان ڕۆحی نەتەوەیە . ئێدوارد ساپیر و بنجامین وۆرف دوو زمانناس، بڕوایان وایە کە زمان و جیهانبینیی مرۆڤەکانی پێوەندییان پێکەوە هەیە . ئەگەر بە وردی سەرنجی وتەی ئەو گەورەکەسانە بدەین ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە پاراستنی زمان بە واتای پاراستنی نەتەوەیە. کەوابوو هەر مرۆڤێک دەبێت بە دوو شێوەی سەرەکی زمانەکەی بپارێزێت: یەکەم فێری زمانی دایکی ببێت و دووهەم فێری کەسانی تر بکات. لە کۆتاییدا دەڵێین کە زمانی ئاخافتن ئەگەر نەبێت بە زمانی نووسین و خوێندنەوە وردە وردە لاواز دەبێت و بەرەو لە ناوچوون دەڕوات.

وانەی سێهەم



**قانع مەریوانی**

لە دوای ئەوەی کە دەرەبەگەکانی ناوچەی مەریوان باوکی ئەم شاعیرەیان ئاوارە کرد ملک و ماڵیان داگیر کرد، بەدەم ئەو لێقەوماوییەوە وەکوو منداڵێکی دەربەدەر لە ڕۆژی ١٥ی ئەیلوولی ساڵی ١٨٩٨ی زایینی لە ئاوایی ڕێشین لە بناری شارەزوور، لە دوای چواردە خوشک چاوی بە دنیا هەڵهێنا. لە تەمەنی ٤٠ ڕۆژیدا باوکی کۆچی دوایی دەکات و دوای ماوەیێکی کەمیش دایکیشی دەمرێت. لە سەرەتای لاویدا تووشی نەخۆشیی تەنگەنەفەسی دەبێت و هەر بەم نەخۆشیەوە ساڵی ١٩٦٥ی زایینی لە دێی لەنگەدێ لە ناوچەی شلێر کۆچێ دوایی دەکات و تەرمەکەیشی هەر لەوێ ئەنێژن. ناوەڕۆکی شێعرەکانی پڕە لە ئەوینی نیشتمان و ڕەخنە و لۆمەی کۆمەڵایەتی.

## له بەندیخانەدا

ئاخریــــن ماڵـــی ژیانـــم کونـــجی بەندیخانەیـــە
ئـــەم کەلەپچـــە مەرهـــەمی زامـــی دڵـــی دێوانەیـــە
زۆر دەمێـــکە چـــاوەڕوانی زرزرەی زنجـــیر ئەکـــەم
سـەیری ئـەم زنجیـرە کـەن وەک زێـوەری شاهانەیە
بووکی ئازادیم ئەوێ خوێنم خەنەس بۆ دەست و پێێ
حەڵقـە حەڵقـەی پێـوەنم بـۆ پلـپلە و لـەرزانەیە
گـەرچی دوژمـن وا ئـەزانێ مـن بـە دیلی لاڵ ئـەبم
ئاخریــــن ماڵـــی ژیانـــم کونـــجی بەندیخانەیـــە
بـــاش بـزانـــێ کونجـــی زینـــدانم قوتابیخانەیـــە
بیـــری ئـازادیـــم لـــە زیـنـدانـــا فـراوانـتـــر ئـەبـــێ
قـورِ بـە سـەر ئـەو دوژمنـەی هیـوای بـە بەندیخانەیە
گـرتـــن و لـێـدان و کـوشـتـــن عـامیلـی ئازادیـیـــە
تـۆپ و شەسـتیر و کەلەپچـە لام وەکـوو ئەفسـانەیە
چـاوەڕوانـــی شـۆڕشـێـــکم عـالـەمـــێ ڕزگـــار بـــکا
میللـــەتم بـــۆ ئـــەو مەبەســـتە کـــردەوەی شـــێرانەیە
چـــەکی شۆڕشـــگێڕی مـــن نووســـین و بیـــر و بـــاوەڕە
ڕاپـەڕیـــنە هـەڵـمـەتـــە پـــڕ نـەعرەتـــەی کوردانەیـــە
گـــەر بـــە ئـــازادی نـــەژیم مـــردن خەڵاتـــە بـــۆ لەشـــم
نۆکـــەری و سەردانەوانـــدن کـــاری نامەردانەیـــە
قانێعـــم ئەمـــڕۆ لـــە زیندانـــا بـــە ئـــازادی ئەژیـــم
ســـەدهەزار لەحنـــەت لـــەوەی وا نۆکـــەری بێگانەیـــە

وانەی چوارەم

# قسەی نەستەق

* برا لە پشت برا بێت ، مەگەر قەزا لە لای خودا بێت!

* شەڕ لە شێف و ئاشتی لە خەرمان!

* تەور کلک خۆی نابڕێتەوە!

* بەرخی نێر بۆ سەربڕین باشە!

* ئۆخەی ئۆخەی هەرکە بۆ خۆی!

* هەرچی هەوڵم دا بگەم بە پایە

مایە و دەسمایەم گشت چوو بە زایە!

* بدە لە ئاو ئەگەر بیشت با

تۆ مەڕۆ بەسەر پردی نامەردا !

* قەل هەڵفڕی ، قشقەڕە لەجێی دادەنن!

وانەی پێنجەم

## نالی



ساڵی ١١٧٣ی هەتاوی لە گوندی خاکوخۆڵ لە ناوچەی شارەزوور لەدایک بووە. نالی زۆربەی ناوچەکانی ئەو دەمەی کوردستان گەڕاوە و تا دوا پلەوی خوێندنی ئەو سەردەمە خوێندوویەتی و ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتووە.شێعرەکانی نالی بەو پەڕی دەسەڵاتی هونەری و جوانییە وتراون، ناوەڕۆکی شێعرەکانی ئاماژەیە بە ئەوین و خواناسی و بیری نەتەوەیی.نالی لەگەل شاعیرانی وەک مەحوی و مەولەوی بە سێ کۆڵەکەی شێعری کلاسیکی کوردی ناویان دەبەن. ئەم کەڵەشاعیرە لە ساڵی ١٢٥٦ی هەتاوی لە شاری ئیستانبوولماڵئاوایی لە ژیان دەکات.

### دوو شێعری بەناوبانگ لە نالی :

تەبعی شەککەرباری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا
ئیمتحانی خۆیە مەقسوودی لە عەمدا وا دەکا
کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردییە خۆکردییە
هەرکەسێ نادان نەبێ خۆی تالیبی مەعنا دەکا

******

شـــەوی یـەلدایــە یـا دەیجـــوورە ئــەمشەو
کـە دیـدەم دوور لـە تـۆ بـێ نـوورە ئەمشـەو
دڵـــم وەک حـاکمـــی مـەعزوولـــە قوربــان
خــەڵاتی وەسـڵی تــۆی مــەنزوورە ئەمشــەو
دڵیـــش مایـــل بـــە دیـــدەی تۆیـــە بۆیــە
لـە مـن وەحشـی و ڕەمیـدە و دوورە ئەمشـەو
کـە تـۆی شـای کـەچ کولاهی دیـدە مەستان
چ بـاکــم قـەیســەر و فـەغفــوورە ئــەمشەو
لـــە خـــەو هەڵســـاوە یـــا ئاڵـــۆزە چـــاوت
هەمیشـــە وایـــە یـــا مـــەخموورە ئەمشـــەو
سـوروشـکم نـەقـشـی چـاوی تـۆ دەکێشـــێ
جێگـەم سـەر دارەکـەی "مەنسـوورە" ئەمشـەو
مـوسـوڵـمانـــان دەپـرســـــن حاڵـــی "نالـــی"
لـــە کـونجی بێکەســی مــەهجوورە ئەمشـــەو

وانەی شەشەم

## ڕۆژی جیهانیی زمانی دایکی

ڕۆژی ٢ی ڕەشەمە لە لایێن ڕێکخراوی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بە ڕۆژی جیهانیی زمانی دایکی ناو نراوە . ئەم ڕۆژە وەبیرهێنەوەی خەباتی درێژخایێن بۆ ڕێزگرتن لە زمانی دایکییە . لە ٢١ی فێڤرییە (٢ی ڕەشەمەی) ساڵی ١٩٥٢ی زایینی لە گۆڕەپانی گشتیی شارێکی بچکۆلە لە باکووری داکا ناوەندی وڵاتی بەنگلادیش چەند خوێندکارێکی زانکۆ بۆ مافی کەڵک وەرگرتن لە زمانی دایکی ( زمانی بەنگلا ) کۆبوونەوەیێکی هێمنانەیان ڕێکخست. لەم کۆبوونەوەیەدا " ئەحمەد سەلیم " شاعیری لاوی بەهەستی بەنگالی لە نێو ئاپۆرەی جەماوەردا هاواری کرد: بژی زمانی دایکی. جەماوەر بۆ ڕێزگرتن لە زمانی دایکی دروشمیان دەدا. ئەحمەد سەلیم بە هەستێکی ئاگرین وتار و هەروەها شێعرێکی بەناوبانگی خۆی خوێندەوە . ئاپۆرەی جەماوەریش مات و حەیرانی هەستی ئەو بوون کە لە ناکاو ئەحمەد سەلیم بە لێدانی گوللەی هێزەکانی ئاسایش کەوتە خوارەوە . بەم بۆنەوە ڕێکخراوی یوونسکۆ لە ساڵی ١٩٩٩ ئەو ڕۆژەی وەک ڕۆژی جیهانیی زمانی دایکی ناساند.

وانەی حەوتەم

**بەشێک لە ڕۆمانی " خانووە داخراوەکە" نووسینی لەتیف هەڵمەت**

کەس نەیدەزانی ئەو خانووە لە کەیەوە دەرگاکەی داخراوە. پیرەمێردەکان دەیانگوت : ئەوەی چووەتە ناو ئەو خانووەوە ئیتر نەهاتووەتە دەرەوە. کچان دەیانگوت: پیرە ژنێک لە خانووەکەدایە و جادووی لە کوڕان کردووە ژن نەهێنن. کوڕان دەیانگوت: دێوێک لە بنی بیرە وشکەکەی خانووەکەدایە هەڕەشەی لە کچان کردووە شوو نەکەن. هەرکەسێک بە لای خانووەکەدا بڕۆیشتایە قسەیێکی لەبارەیەوە هەڵدەبەست. کەس نەبوو ئەم جۆرە هەواڵانە بەدرۆ بخاتەوە. تەنانەت پیرەژنێک دەیگوت : ئەو خانووە چل شازادەی تیایە و هەر یەکەو چل ژنیان هەیە. دەنگوباسی خانووەکە تەشەنەی کرد ، خەڵک ترسی لێ نیشت و سەرۆکی شارەوانی بۆ ئەوەی چارەسەریی ئەو بشێوییەی شار بکات بڕیارێکی دەرکرد خانووە داخرواەکە بڕووخێنرێ ... یەکەم شۆفڵ کە چووە پێشەوە لاوێکی باڵابەرزی چوارشانەی سمێڵ زل بوو... لەپڕ کەوتە خوارەوە و کاتێک لە نەخۆشخانە هاتەوە هۆش خۆی ،گوتی: کە ویستم خانووە داخراوەکە وێران کەم تارمایی ڕێی لێگرتم ...باڵێکی لە ڕۆژئاوا و باڵێکی تری

لە ڕۆژهەڵات بوو... فوویێکی لێ کردم و لە شۆفڵەکە کەوتمە خوارەوە . لەو کاتە بەدواوە هیچ شۆفیرێک نەیوێرا توخنی خانووە داخراوەکە بکەوێ... تا وای لێهات سەرۆکی شارەوانی خۆیشی وای دەخستە ڕوو کە دێوێک هەڕەشەی لێ کردووە نابێ خانووە داخراوەکە بڕووخێنرێ . نیوە شەوێک خەڵکی شار بڕیاریان دا شارەکە چۆڵ بکەن و بڕۆن لەو دیو چیای بەرامبەری شارەکە ، شارێکی تر درووست بکەن... کە گەشتنە ئەو دیوی چیاکە لە ماوەی چەن کاتژمێرێکدا هەزاران خێوەتی جوان هەڵدرابوو ، زەردەخەنە گەڕایەوە سەر لێوی خەڵکەکە و بڕیاریان دا کە ڕۆژ بوویەوە گەورەترین ئاهەنگی ڕزگاری بگێڕن... زۆر ماندوو بوون ، نووستن. کە ڕۆژ بووەوە لە پڕ منداڵێک لە بەردەم خێوەتێکدا هاواری کرد: ئەوە خانووە داخراوەکەیە... بە ناوی خانووە داخراوەکەوە هەموو خەڵکەکە لە ناخەوە ڕاچڵەکین و بە پەلە هاتنە دەرێ و ڕوانییان خانووە داخراوەکە بەرامبەر خێوەتەکانیان قوت بووەتەوە. . . هەموویان حەپەسان . . . " ئەرێ بشێ هەموو شارێک خانوویێکی داخراوی تیا نەبێ...؟!

وانەی هەشتەم



**شێرکۆ بێکەس**

شێرکۆ بێکەس کوڕی شاعیری ناسراوی کورد فایەق بێکەس لە ساڵی ١٩٤٠ی زایینیدا لە سلێمانی لەدایک بووە. ژیانی شێرکۆ ئاوێتەیێکە لە خەبات و خۆشەویستی. لە ساڵی ١٩٧٨ خەڵاتی جیهانیی "توخولسکی" کە خەڵاتێکی ئەدەبییە ، لە دەست سەرۆک وەزیرانی وڵاتی سوئێد "ئینگوار کارلسن" وەرگرت. هەروەها لە لایەن گەورەترین ئەنجومەنی شارستانیی ئیتالیا بە ناوی "ئەنجومەنی فلۆرانسی ئیتالیا" نازناوی هاوشاریی پێ دراوە. شێعرەکانی بە زۆرێک لە زمانەکانی جیهان وەکوو: ئاڵمانی ، فەڕانسەوی ، ئیتالیایی ، سوئێدی ، نۆروێژی ، عەرەبی و فارسی وەرگێڕدراون. سەی عەلی ساڵحی شاعیری گەورەی فارس وتوویەتی: شێرکۆ ئیمپراتووریی شێعری دنیایە.

**هەندێ لە بەرهەمە شێعرییەکانی :**

١)دەربەندی پەپووله ٢) خاچ و مار ٣)نسێ ٤) ژن و باران
٥)گۆڕستانی چراکان ٦)بەردەقارەمان و مامە یارە ٧)کازیو ٨) کەژاوەی گریان

## قەڵەم

قەڵەمێ سەری خۆی هەڵگرت
هیچ دەفتەر و هیچ کاغەزێ
نەیانزانی ڕووی لە کوێ کرد
چونکە ویستیان دای بدەن و خۆی بە خۆی بکوژێننەوە!
چونکە ویستیان وا بنووسێ هەر بە تەنیا سوڵتانەکان بیخوێننەوە!

## خۆشەویستی

گوێم نا بە دڵی خاکەوە
باسی دڵداریی باران و خۆی بۆ کردم
گوێم نا بە دڵی ئاوەوە
باسی خۆشەویستیی خۆی و سەرچاوەکانی بۆ کردم
گوێم نا بە دڵی دارەوە
باسی خۆشەویستیی خۆی و گەڵاکانی بۆ ئەکردم
کە گوێشم نا بە دڵی خۆشەویستی ، خۆیەوە ، ئەوسا :
باسی سەربەستیی بۆ ئەکردم!

وانەی نۆهەم

## چەند بەندێک لە بەندەکانی مافی مرۆڤ

١. هەموو مرۆڤەکان بە ئازادی لەدایک دەبن و یەکسانیشن لە نرخ و پێگە و مافدا و دەبێت بە ڕۆحێکی برایانە هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکدا بکەن.

٢. هەموو مرۆڤێک بێ هیچ جیاوازییێک ، وەکوو جیاوازی بە هۆی ڕەگەز ، ڕەنگ ، جنس ، زمان ، ئایین ، بیروڕای سیاسی و یان هەر شتێکی تر شیاوی کەڵکوەرگرتنە لە تەواویی ئەو ماف و ئازادییانەی کە لەم بانگەوازەدا هاتوون.

٣. هەموو کەسێک مافی ژیان و ئازادیی خۆی هەیە.

٤. هیچ مرۆڤێک ئەشکەنجە و سزا نادرێت و هەڵسوکەوتی توندوتیژی لەگەڵدا ناکرێت.

٥. هیچ مرۆڤێک نابێت بە شێوەییێکی ڕەمەکی بگیردرێت و دوور بخرێتەوە.

٦. هەموو کەسێک مافی ئازادی و بەشداربوونی کۆمەڵە و دەستە و تاقمە ئاشتیخوازەکانی هەیە.

وانەی دەهەم




## هێمن

موحەممەد ئەمین شێخولئیسلامیی موکری، ناسراو بە هێمن، ساڵی ١٩٢١ی زایینی لە دێی شیلاناوێ سەربە شاری مەهاباد لەدایک بووە. لە ساڵی ١٩٤٦ لە کۆماری کوردستاندا لە مەهاباد نازناوی "شاعیری نەتەوەیی"ی پێبەخشراوە. ساڵی ١٩٧٠ لە بەغدا ئەبێتە ئەندامی لێهاتووی کۆڕی زانیاریی کورد. لە ساڵی ١٩٨٥ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی سەلاحەدینی ئەیووبی و هەروەها گۆڤاری سروە دادەمەزرێنێت ، کە دەبێتە بنکە و قوتابخانەیێک بۆ کۆبوونەوە و چالاکی‌نواندنی گشت ئەو کوردە ڕووناکبیرانەی کە ساڵانی دوایی بوون بە ڕێبەرانی ویژەی کوردی. ناوەڕۆکی شێعرەکانی هێمن وەکوو زۆربەی شاعیرانی تری کورد بریتییە لە ئەوین و خۆشەویستی بۆ نیشتمان.

**هەندێک لە بەرهەمەکانی :**

١) تاریک و ڕوون　　　٢) ناڵەی جودایی

٣) چەپکێک گوڵ و چەپکێک نێرگز　　٤) پاشەڕۆک (وتار)

## تۆم هەر لەبیرە

لــە شاییــدا لــە وەختــی هەڵپەڕینــا
لــە خۆشیــدا لــە کاتــی پێکەنینــا
لــە کــۆڕی ماتــەم و گریــان و شــینا
**ئەمن ئەی نیشتمان تـۆم هـەر لـەبیرە**
بە شەو تاکوو بە سەرما زاڵ دەبێ خەو
بــە ڕۆژ تـاکــوو دووبــارە دێتــەوە شـــەو
لە کاتێکدا کە دەدوێنـــم ئەم و ئەو
**ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر لـەبیرە**
دەکــەم تـەرخـان لە ڕێـی تـۆدا ژیانم
لــە ســەنگەردا بــەرەوڕووی دوژمنــانم
بـە خـاکـی تـۆ دەمـی ئاویلـکەدانـــم
**ئەمن ئەی نیشتمان تـۆم هـەر لـەبیرە**

وانەی یانزەهەم



## گۆران

عەبدوڵڵابەگی کوڕی سلێمان بەگ، ناسراو بە گۆران، لە ساڵی ١٩٠٤ی زایینی لە هەڵەبجە لەدایک بووە. لە ساڵی ١٩١٢ دەڕوات بۆ کەرکووک و لە مەکتەبی "عیلمییە"ی ئەوێ درێژە بە خوێندن دەدات. لە ساڵی ١٩٥٨ لە زانستگەی بەغدا دەبێتە مامۆستای زمان و وێژەی کوردی. مامۆستا گۆران لە سەرەتاوە لەسەر کێشی عەرووزی شێعری داناوە ، بەڵام دوایی کە هەستی کرد شێعری عەرووزی لە سەردەمی نوێدا بۆ دەربڕینی هەست و برینی ڕێگای پڕ لە هەورازی خەباتی کۆمەڵایەتی کز و لاوازە ڕووی کرد لە شێعری خۆماڵیی کوردی و شۆڕشێکی لە شێعری کوردیدا خولقاند کە چارەنووسی شێعری کوردیی بە تەواوی گۆڕا و بوو بە دامەزرێنەری سەرەکیی شێعری نوێی کوردی.

## بەری بەیانە

**بەری بەیانە ڕووناکە ئاسۆ**
**ئاسۆی هیوای کورد مژدە بێ لە تۆ**
دەنگی بانگ هەڵسا لە مزگەوتی دێ
باڵدار هێلانەی خەو بەجێ دێڵێ
قاسپە قاسپی کەو ئاشکرا ئەڵێ
کاتی فرمان هات کورد نابێ بنوێ
هەڵسە ئەی لاوی نیشتمانی کورد
سەردەمی هەڵسان هەرکەسێ نووست مرد
پێویستی پیرۆز بەڵام سەخت و ورد
چاوەڕوانتە هەڵسە دەستوبرد
بۆ بەختیاری و سەربەخۆیی گەل
لەگەڵ هاوڕێتا پەل بدەرە پەل
کەی دەرچوو تیشکی هەتاو لە دەم کەل
وریا بی زۆر چاک بەکار بێنی هەل
**بەری بەیانە، ڕووناکە ئاسۆ**
**ئاسۆی هیوای کورد مژدە بێ لە تۆ**

## بەشی ٤ :

# کورتەییێک لە مێژووی وێژەی کوردی

کورتە باسێک لەسەر:

* مێژووی شێعری کلاسیک و نوێی کوردی
* شاعیرانی ناوداری شێعری کلاسیکی کوردی
* شاعیرانی ناوداری شێعری نوێی کوردی

### ٤-١ . سەردەمی شێعری کلاسیک ، قوتابخانەی کرمانجیی باکوور :

هاودەنگیی گشتی هەیە لەسەر پێوەندیی نێوان پەیابوونی شێعری کوردی و دامەزراندنی ئەمارەتە کوردییەکان لە سەدەی شازدەهەمدا. پێکهێنانی پاشایەتیی سەفەوی وەکوو هێزێکی دژ بە ئایینی پاشایەتیی عوسمانی ، لە سەرەتای سەدەی شازدەدا بارودۆخێکی نوێی بەدی هێنا ، کە بوو بە هۆی گۆڕانێکی لەبەرچاو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. لە قۆناغی یەکەمدا ، شەڕ لە نێوان دوو پاشایەتیدا دەستی پێ‌کرد. پاشایەتیی عوسمانی بەزوویی دەستی‌کرد بە بەهێزکردنی ئەمارەتە کوردییەکانی نێوان سنوورەکانی خۆی و هەروەها ئەمارەتی نوێی کوردیشی پێک هێنا. بۆتان بە ناوەندیی جەزیرە ، یەکێ لە کاریگەرترین ئەمارەتەکانی مێژووی کوردستان بوو. بۆتان بە هۆی بارودۆخی باشتر لەوانی تر ، وەکوو ناوەندی گرینگی فەرهەنگیی کوردی خۆی نواند. هەر بۆیە یەکەم قوتابخانەی شێعری کلاسیکی کوردی لە زاراوەی کرمانجیی ژووروودا دامەزرا. مەلای جەزیری(١٦٤٠-١٥٧٠) نوێنەری سەرەکی و ئەتوانین بڵێین باشترین نوێنەری شێعری کلاسیکی کوردیی ڕۆژهەڵاتە. ناوی کوردستان لە شێعرەکانی جەزیریدا بە زۆری و شانازییەوە دەردەکەوێت. دوو کەسی تر لەو سەردەمەدا یەکێکیان فەقێ تەیرانە(١٦٦٠-١٥٩٠) و ئەوی تریان ناوی ئەحمەدی باتایە کە یەکەم مەولوودنامەی کوردیی نووسیوە. هەروەها لە نیوەی دووهەمی سەدەی حەڤدەدا ئەحمەدی خانی(١٧٠٧-١٦٥١) یەکێک لە ڕێبەران و شاعیرانی هەڵکەوتووی کورد بوو. کاریگەریی ئەو لە سەر زمان و فەرهەنگی کوردی تا ئەمڕۆش هەر بەردەوامە. خانی بێجگە لە

بەرهەمی "مەم و زین" کە جوانترین وێنەی حیماسیی ڕۆژهەڵاتییە ، یەکەمین فەرهەنگۆکی بە ناوی "نۆبەرەی منالان" نووسیوە کە فەرهەنگێکی عەرەبی_کوردییە. هەروەها بەرهەمێکی تری سەبارەت بە دین بە ناوی "عەقیدەی ئیمان" نووسیوە.

## ٢-٤ . قوتابخانەی هەورامی :

ئەمارەتێکی تری کورد کە بوو بە ناوەندی فەرهەنگیی کوردی ، ئەمارەتی ئەردەڵان بوو ، بە ناوەندیی سنە. قوتابخانەی شێعری کلاسیکی کوردی لە ئەمارەتی ئەردەڵاندا بە ترۆپکی خۆی گەیشت . کاریگەریی فەرهەنگیی ئەم ئەمارەتە سنوورەکانی تێپەڕاند و بوو بە پێوەری شێعری لە سەرانسەری ناوچەکەدا . زمانی ئەدەبیی ئەردەڵان زاراوەی هەورامی بوو کە زۆربەی شاعیرانی مەزنی کورد وەکوو: خانای قوبادی (١٧٥٩ - ١٧٠٠) ، بێسارانی ( ١٧٠٢ - ١٦٤٢ ) ، مەولەوی(١٨٨٢-١٨٠٦) و ئەحمەد بەگی کۆماسی بەم زاراوەیە نووسیویانە. مەولەوی نوێنەری پایەبەرزی ئەم قوتابخانە شێعرییەیە و وەکوو یەکێک لە سێ کۆڵەکەی گەورەی مێژووی شێعری کلاسیکی کوردی دەناسرێت. بە ڕووخانی ئەمارەتی ئەردەڵان لە نیوەی سەدەی نۆزدەدا قوتابخانەی هەورامانیی شێعر بە هێمنی ڕووی لە کزی کرد و کۆتاییی پێ هات.

## ٣-٤ . قوتابخانەی کرمانجیی باشوور :

هەر وەکوو ئەو دوو ئەمارەتە کە لە سەرەوە باسیان لێ‌کرا ، ئەمارەتێکی تری کورد کە بوو بە ناوەندی فەرهەنگیی کورد ، ئەمارەتی بابان بوو، بە ناوەندیی سلێمانی. قوتابخانەی شێعری کلاسیکی کوردی لەم ئەمارەتە ئەوەندە بەهێز بوو کە کاریگەرییەکەی تاکوو ئەمڕۆش هەر بەردەوامە. لە ساڵی ١٧٨٤(ز) ئیبراهیم پاشای بابان شاری سلێمانیی دامەزراند وکردی بە پێتەختی خۆی. هەبوونی ڕێژەیێکی زۆری قوتابخانە ، مزگەوت ، مامۆستا ، مەلا و زانیار لە ماوەیێکی زۆر کەمدا ئەو شارەی کرد بە یەکێک لە گرینگترین ناوەندە فەرهەنگییەکان. ئەم قوتابخانەیە بەزوویی و بۆ ماوەیێک فەرهەنگی کوردیی دەرەوەی ئەو دەسەڵاتەیشی خستە بەر کاریگەریی خۆیەوە. ئەو زاراوە ئەدەبییە کە لە سلێمانی پەرەی سەندبوو ، لەسەر بناغەی چەند لقی زاراوەی کرمانجیی باشوور بوو کە لە ناوچەکانی شارەزوور و قەرەداغدا قسەی پێ دەکرا . نالی(١٨٧٠یا١٨٥٥-١٧٩٧) ، سالم(١٨٦٦-١٨٠٠)و کوردی (١٨٦١-١٨٠٠) گەورەشاعیران و ڕێبەرانی ئەم قوتابخانەیەن . هەروەها شاعیرانی هەڵکەوتووی تریش لەم قوتابخانەیەدا بەدی دەکرێن ، ئەو شاعیرانەی کە هەر یەکەیان بە شێوەیێکی تایبەت لەسەر زمان و فەرهەنگی کوردی کاریگەرییان بووە . وەکوو : حاجی قادری کۆیی(١٨٩٧-١٨١٧) ، شێخ ڕەزای تاڵەبانی(١٩١٠-١٨٣٦)، وەفایی(١٨٩٢-١٨٣٦)، ئەدەب(١٩١٧-١٨٦٢) ، مەحوی(١٩٠٩-١٨٣٠) و ... . حاجی قادر بەدوای ئاگادارکردنەوەی خەڵک و یارمەتی بەوان بوو بۆ لەناوبردنی گرفتی نەخوێندەواری و دواکەوتوویی. شێخ ڕەزای تاڵەبانی

پێگەیێکی بەرزی هەیە لە ئەدەبی کوردیدا. شێخ ڕەزا ڕەخنەگرێکی کۆمەڵایەتی بوو کە لە شێعرەکانیدا نابەرابەری ، کەموکوڕی و ناتەبایی کۆمەڵی دەخستە بەرچاو. مەحوی گەورە شاعیرێکی سۆفی بوو کە لەگەڵ مەلای جەزیری و مەولەوی باشترین کۆمەڵی شێعری ئوستوورەیی کوردی پێک دێنن. بەرهەمەکانی مەحوی پلەیێکی بەرزی شێعرییان لە شێعری کلاسیکی ڕۆژهەڵاتیدا هەیە و هەمووکات وەکوو کۆڵەکەی مەزنی شێعری کلاسیکی کوردی دەمێنێتەوە.

## ٤-٤ . سەردەمێکی نوێ ، گۆڕانێکی گەورە :

کۆتایی سەدەی نۆزدە و دەسپێکردنی سەدەی بیستەم ، قۆناغێکی شێواو بوو کە گۆڕانێکی بنەڕەتی بۆ کوردان و خەڵکی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ، بەتایبەت لە ئیمپراتۆریای عوسمانیدا هێنایە گۆڕێ. هاوکات لەگەڵ زۆربوونی زوڵم و زۆرداریی پاشایەتیی عوسمانیی تورکاندا ، ئایدیاگەلی نەتەوەخوازانەی خەڵکی ژێرچەپۆکەی ناوچەکە دەستی پێ کرد. کێشەی ئەوان بووژاندنەوەی زمان ، مێژوو و فەرهەنگی نەتەوەیی و لەرزاندنی دەسەڵاتی عوسمانی و دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی بوو. لە ئاکامی گەشەی بەئاگابوونی نەتەوەییدا تاقمێک ڕێکخراوە پێشکەوتن : ڕێکخراوگەلێک لە ژێر ناوی ڕێکخراوی فەرهەنگی ، لاوان ، قوتابییان ، ژنان و هەروەها شەپۆلی کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە بڵاو بوونەوە. یەکەم ڕۆژنامەی کوردیش لەم قۆناغەدا دەرچوو. ڕۆژنامەیەک بە ناوی کوردستان کە بۆ جاری یەکەم لە قاهیرە لە ٢٢ی ئاوریلی ١٨٩٨دا لە لایێن مێقداد بەدرخان ، لە چاپ درا کە لە نێوان

ساڵەكانی ١٨٩٨ تا ١٩٠٢دا سەرجەم ٣١ ژمارەی دەرچوو. لە ناوەوەی حكوومەت و ئەرتەشی عوسمانیدا تاقمێك ڕووناكبیری كورد هەبوون كە ئەستەمووڵیان كردبووە بنكەی خۆیان و دواتر بوون بە هێزی پشتیوانیی بزووتنەوەی نەتەوەییی كورد بۆ پەرەسەندنی زمان و فەرهەنگی كوردی لە كوردستانی باشووردا. پێشكەوتنی نەتەوەییی خەڵك لە ناوچەكەدا هێزی داگیركەری سوڵتان عەبدولحەمیدی بەرەو پاش كشاند تاوەكوو لە ساڵی ١٩٠٨دا عەبدولحەمید تەسلیمی بڕیاری بەڕێوەبردنی چاكسازیی یاسایی بوو كە زۆرێك لە مافە سیاسی و فەرهەنگییەكانی خەڵكی دەپاراست. لەئاكامدا كۆمەڵێك ڕۆژنامە و گۆڤاری كوردی لەدایك بوون ، بۆ وێنە : ڕۆژی كورد (ئەستەمووڵ ١٩١٣ ) ، یەكبوون ( ئەستەمووڵ ١٩١٣ ) ، بانگی كورد ( بەغدا ١٩١٤ ) ، كوردستان(مەهاباد و ورمێ١٩١٤) ، كوردستان(ئەلیپۆ١٩١٥) ، ژین (ئەستەمووڵ ١٩١٥) ، كوردستان (ئەستەمووڵ ١٩١٩). دوای ئەوەی كە پاشایەتیی عوسمانی ڕووخا لە سەرەتاوە بە پێی بڕیارنامەی سیڤەر لە ساڵی ١٩٢٠دا بڕیار وابوو كە كوردستانیش ببێت بە وڵاتێكی سەربەخۆ بەڵام ئەم بڕیارە بە پێی بەرژەوەندیی سیاسیی تایبەت دانرابوو بۆیە نەهاتە دی. لە ئاكامدا بە پێی بڕیارنامەی لۆزان لە ساڵی ١٩٢٣دا سنوورە نوێكانی توركیە كە نیوەی كوردستان بوو هاتە گۆڕێ و هەروەها كوردستانیش لە نێوان دەوڵەتانی ئێران و ئێراق و سووریا دابەش كرا و بەشێكی تریش لە كوردستان چووە سەر خاكی كۆماری ئەرمەنستان. ئەم دابەشبوونە بوو بە هۆی گۆڕانێكی بنەڕەتی لە ژیانی فەرهەنگی ، ئابووری و كۆمەڵایەتیی كورددا. لەوە بەدوا كوردستانی باشوور بوو بە بنكەی زمان و فەرهەنگی كوردی. ئاگادارانی كورد كە لە

بزووتنـەوەی پاشـایەتیی عوسـمانیدا چالاکییـان هـەبوو ، ئێسـتا لـە کوردسـتانی باشووردا نیشتەجێ بوون. لە نێوان ئەم تاقمـەدا ئەوانـەی لـەم دواییانـەدا ڕۆڵـی گرینگیان لە ژیانی فەرهـەنگیی کوردستانی باشووردا هـەبوو ، دەکرێت ئاماژە بکەین بەم کەسانە : تۆفیق وەهبی(١٨٩١-١٩٨٤) ، پیرەمێرد (١٨٦٧-١٩٥٠) ، موحەممەد ئەمین زەکی(١٨٨٠-١٩٤٨).

## ٥-٤ . بەرەو شێعری نوێ :

شێعری نـوێی کـوردی لـە ئاوەها بارودۆخێکدا سـەری هەڵدا. یەکەم شاعیری بەرچاوی شێعری نوێی کوردی شێخ نووری شێخ سالّح (١٩٠٥-١٩٥٨) بـوو ، کە ئایدیای مـۆدێرنیزمی (نوێخـوازی) هێنایـە نـاو ڕەخنـەی ئەدەبییـەوە. نـووری بەبۆنـەی سـەرقاڵیی سیاسـیی زۆرەوە ، هـەرگیز نـەیتوانی بـەو پلـە و پایـە و کاریگەرییـە لـە ئـەدەبی کوردیـدا بگـات. گـۆران(١٩٠٤-١٩٦٢) کـە دواتـر بـە بـاوکی نوێخـوازیی کـوردی ناسـرا ، بێگومـان شـۆڕشـێکی لـە شـێعری کوردیـدا خولقاند. لەو سەردەمەدا شێعری کوردی پڕ بوو لە چەند سالّ میراتـی دەرەکـی ، بە تایبەت عـەرەبی ، گـۆران خـۆی لـە کارتێکردنی ئـەو میراتـە خستە لاوە و شـێواز و زمـان و نـاوەڕۆکێکی پـێ دا کـە بناغەکـەی لەسـەر ڕاسـتیی کـورد و فەرهـەنگ و سرووشـت و نەریتـە فۆلکلۆرەکـانی کـورد دانرابـوو. عـەرووزی عەرەبی جێگەی خۆی دا بە شێوەگەلێک کە ئاخێزگەیان گۆرانی خۆجێیی کورد بـوو و وشـەکانی لـە عـەرەبی و زمانـانی تـر پاڵفتـە بـوون. نـاوەڕۆکی سـەرەکیی شێعرەکانی گـۆران ئاماژەیـە بـۆ ئـازادی ، ئەوینـە بـۆ کوردسـتان ، بـۆ ژن ، بـۆ سرووشت. شێوەی گۆران بۆ پیشاندانی سرووشت لـە ئـەدەبی کوردیـدا تـاک و

تایبەتە. لە بوارەکانی تریشدا ، گۆران نزیکیی تایبەتی بە گەورە شاعیرانی نوێخوازی ئەورووپی پیشان دەدات. ژیانی شێعریی گۆران بە سێ قۆناغی جیاوازدا دابەش دەکرێت: لە قۆناغی یەکەمدا ، گۆران پا دەنێتە جێگەپای پێشینیانی شێعری کلاسیکی کوردی. لە قۆناغی دووهەمدا بەرەو ڕۆمانتیک دەڕوات کە لێرەدا ژن و سرووشت دوو ناوەڕۆکی سەرەکین. لە قۆناغی سێهەمدا دەس‌دەکات بە تێپەڕین لە شێعری کلاسیکی کوردی و چوون بەرەو شێعری نوێ. شاعیرگەلێکی تر هەن کە وەکوو دەڵێن لە بەرەی گۆرانن(قۆناغێک لە بیستەکانەوە تا دوایین ساڵەکانی ١٩٦٠)، کە لە پەرەسەندنی شێعری نوێی کوردیدا بەشدارن. ئەو شاعیرانە بریتین لە : پیرەمێرد ، ئەحمەد موختار جاف، فایەق بێکەس ، دڵدار ، ئەحمەد هەردی ، قانیع و . . . . بەڵام سێ شاعیر هەن کە سەرنجی تایبەتیان ڕاکێشاوەتە سەرخۆ : جگەرخوێن (١٩٨٤-١٩٠٣)،هەژار (١٩٩١-١٩٢٠) ، هێمن(١٩٨٦-١٩٢١). جگەرخوێن بە زاراوەی کرمانجیی ژووروو دەینووسی. کاریگەریی شێعری ئەو لەسەر جەماوەر و فەرهەنگی کوردی لە باکوور و ڕۆژئاوای کوردستان تا ڕادەیێک بوو کە تێکڕای ئەو قۆناغە بە قۆناغی جگەرخوێن لە شێعری کرمانجیی ژوورووداا ناو نراوە. شێعری ئەو ئاسایی ، شۆڕشگێڕانە و جەماوەرییە، هەرچەند کە ئەو حاڵەتە هەروەکوو شێعرەکانی هەژاریش بووەتە هۆی لەدەسچوونی باری جوانیناسانەی شێعرەکانی. بەڵام شێعری هێمن بەپێچەوانەی ئەوانە و بە شێوەیێکی شیاو و بەهێزتر لەوانە. زمانی هێمن زۆرتر غەناییە و بەرەو درووشمە سیاسییەکان تا ڕادەیێکی زۆر کەمترە. لە مەودای نێوان بەرەی گۆران و بەرەی نوێی شێعریی ساڵەکانی حەفتادا، بەرەیێکی

ناوەندی هەبوون کە ڕۆڵێکی بچووکتریان هەبوو لە ئەدەبی کوردیدا ، بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بدەین بەم کەسانە: کاکەی فەللاح ، دڵدار ، دیلان ، کامەران موکری ، جەماڵ شارباژێڕی. دوو شاعیری تر لە بەرەی گۆران هەن کە کەمتر ناسراون ، قەدری جان(١٩١٦-١٩٧٢) و سوارەی ئیلخانیزادە (١٩٤٠-١٩٧٦). قەدری جان لە کوردەکانی ڕۆژئاوای کوردستان بوو.ئەو یەکێک لە مۆدێرنیستە هەڵکەوتووەکان و یەکێک لە خولقێنەرانی دوو لایەنی ناوەڕۆک و شێوازە(فۆرم) لە شێعری کوردیدا. سوارەی ئیلخانیزادە لەدایکبووی شاری بۆکان بوو . سەرەڕای ژیانی کورت ، بەرهەمانێکی ئەدەبیی بەرزی بەجێ هێشت ، بەڵام ئەویش وەکوو قەدری جان بۆ هاوچەرخەکانی نامۆ بوو. پاش کوودیتای ١٩٥٨ و گۆڕانی حکوومەتی ئێراق بە کۆماری ، کوردەکان گەیشتنە بەشێکی زۆر لە مافەکانیان و ئەمەش بوو بە هۆی پێشکەوتنی بنەڕەتیی فەرهەنگی کوردی. ڕێکخراوە فەرهەنگی و سیاسییەکان خۆیان گرت و دەیان گۆڤار و سەدان کتێب بڵاو بوونەوە. بەڵام ئەم بارودۆخە لەبارە ماوەیێکی زۆری نەخایاند ، بۆیەساڵەکانی ١٩٦٠ بۆ گەلی کورد ، قۆناغێکی پڕ لە تراژێدی بوو. شەڕ ، بۆردوومان ، کوشتاری بەکۆمەڵ و هێرش بۆ کۆمەڵە مەدەنییەکان ، کە تێکڕای ژیانی فەرهەنگی لەم بارودۆخەدا هاتە وەستان. بەڵام هەر لەو کاتەدا بزووتنەوەی کوردان ڕۆژبەڕۆژ بەهێزتر دەبوو، تا ڕادەیێک کە حوکوومەت ناچار بوو لە ١١ی مارسی ١٩٧٠دا بڕیارنامەیێک لەگەل بزووتنەوەی کورددا واژۆ بکات. ئەمە سەرەتای قۆناغێکی پڕ لە ئاشتی بوو کە کوردان بە زۆر شت گەیشتن. زمانی کوردی بوو بە زمانی یاسایی تەواو قوتابخانەکانی ناوچەی کوردستان. دەیان گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی دیسان دەرچوو. کوردەکان

یەکێتیی نووسەرەان و ئاکادێمیی زانست و زانستگەییێکیان لە سلێمانی ڕێک خست. ئەم پێشکەوتنە فەرهەنگییە هەروەها تەقینەوەییێکی بەهێزی ئەدەبیی لەگەڵدا بوو. تەقینەوەییێک لە لایێن شاعیرانی لاو کە دەستیان کرد بە چاندنی تۆمی قۆناغێکی نوێ لە ئەدەبی کوردیدا و هێشتا هەر بەردەوامن. ئەم شاعیرانە کە بە بەرەی پاش گۆران دەناسرێن پاش چەند ساڵ خەو و بێدەنگیی شێعری کوردی خوێنێکی نوێیان ڕژاندە ناو ڕەگ و هەناویەوە و ناوەڕۆکی نوێیان دایە شێعری کوردی. لە ساڵی ١٩٧٦دا دیسان ئاگری شەڕ لە نێوان کوردەکان و حوکوومەتی ئێراقدا هەڵگیرسایەوە کە ڕووداوەکانی ئەم ساڵانە دەستێکی بەهێزیان بوو لە ئەدەبی کوردیدا. بەرەی نوێی شاعیرانی لاوی دەوروبەری ٣٠ ساڵ لەم بارودۆخەدا سەریان هەڵدا. لە نێو شاعیرانی ئەم بەرەیەدا دەکرێت ئاماژە بەم کەسانە بدرێت : لەتیف هەڵمەت ، شێرکۆ بێکەس ، عەبدوڵڵا پەشێو ، فەرهاد شاکەلی ، ئەنوەر قادر موحەممەد و ڕەفێق سابیر کە لەو کاتەوە تاکوو ئێستا درێژەیان داوە بە چالاکیی خۆیان لە بواری شێعری نوێی کوردیدا.

| ژمارە | پیتە نەبزوێنەکان | | |
|---|---|---|---|
| | کوردی | فارسی | وشە |
| ١ | ئ | ئ ، ا | ئامانج |
| ٢ | ب | ب | بەناز |
| ٣ | پ | پ | پرشنگ |
| ٤ | ت | ت | تارا |
| ٥ | ج | ج | جووتیار |
| ٦ | چ | چ | چیا |
| ٧ | ح | ح | حەیران |
| ٨ | خ | خ | خەبات |
| ٩ | د | د | دیمەن |
| ١٠ | ر | ر | ئایرین |
| ١١ | ڕ | - | ڕامان |
| ١٢ | ز | ز | زانا |
| ١٣ | ژ | ژ | ژیلوان |
| ١٤ | س | س | ساکار |
| ١٥ | ش | ش | شیلان |
| ١٦ | ع | ع | عەوداڵ |
| ١٧ | غ | غ | غونچە |
| ١٨ | ف | ف | فرمێسک |
| ١٩ | ڤ | - | ڤیان |
| ٢٠ | ق | ق | قانێع |
| ٢١ | ک | ک | کانیلان |
| ٢٢ | گ | گ | گەشین |
| ٢٣ | ل | ل | لاوین |
| ٢٤ | ڵ | - | هەڵاڵە |
| ٢٥ | م | م | مەریوان |
| ٢٦ | ن | ن | نیشتمان |
| ٢٧ | و | و | وریا |
| ٢٨ | هـ | هـ | هۆزان |
| ٢٩ | ی | ی | کەویار |

| ژمارە | پیتە بزوێنەکان | | |
|---|---|---|---|
| | کوردی | فارسی | وشە |
| ١ | ە ـە | فتحە | هەڤاڵ |
| ٢ | ێ | کسرە | ڕێژنە |
| ٣ | ۆ | ضمە | ڕۆژان |
| ٤ | ا | ا | ئالان |
| ٥ | ی | ی | کانی |
| ٦ | وو | و | سنوور |
| ٧ | و | - | کوردستان |
| ٨ | "بزرۆکە" | - | شنیا |

**خوێنەری بەڕێز:**

**گشت کاروباری ئەم کتێبە (نووسین،تایپ،دیزاین،چاپ) لەئەستۆی نووسەر بووە و لەوانەیە هەڵەی تێدا بەدی بکرێت ، تکایە ئەگەر هەربۆچوون و ڕەخنەیێکتان هەیە، بۆ ڕەچاوکردنی لە چاپەکانی داهاتوودا ، بینێرن بۆ ئەم ئیمەیلە:**

aramsalehi@yahoo.com

## سەرچاوەکان :

١. آواشناسی و دستور زبان کردی ، دکتر علی رخزادی ، انتشارات ترفند ،١٣٧٩

٢. آموزش زبان کردی ، دکتر علی رخزادی ، انتشارات کردستان ، ١٣٨٦

٣. آموزش زبان کردی ، دکتر مصطفی خرم دل ، انتشارات هەژار ، چاپ اول

٤. لە شاخەوە تا شار ، فەخرەدین ئامێدیان ، پەخشانگای ئازادی ، سلێمانی

٥. یادگیری زبان کردی قدم بە قدم ، عدنان عبدالرحمان سجادی ، وەزارەتی ڕۆشنبیری ، ٢٠١١

٦. زبانشناسی و دستورزبان کردی، مصطفی کاوه ، نشر احسان ، ١٣٨٤

٧. زمان و ڕێنووسی کوردی ، مەسعوود محەمەد ، دەزگای ئاراس ، هەولێر٢٠١١

٨. خوێندنەوە و ڕێنووسی کوردی ، عدنان برزنجی و علیرضا نصرتی ، دانشگاه کردستان١٣٨٨

٩. ڕاسپاردەکانی کونفڕانسی بەرەو ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی،ئەکادیمیای کوردی، هەولێر٢٠٠٠

١٠. ئەدەبیاتی کلاسیک و نوێخوازی کوردی،دوکتور کەماڵ مەعرووف ،وەزارەتی ڕۆشنبیری٢٠٠٠

١١. کەلەپووری کوردی ، محەممەد عارف مودەڕڕیسی ، کتێب فرۆشیی شێخی ، ١٣٨٤،١٣٨٧

١٢. هەنبانەبۆرینەی مامۆستا هەژار

١٣. وەرزنامەی زرێبار ،زمان و کۆمەڵگا ، ژمارەی ٧٥ و ٧٦،زستانی١٣٩٠

١٤. وەرزنامەی زرێبار ، ئەدەبیات و فەرهەنگ ،ژمارەی ٥٨و٥٩ ، زستانی١٣٨٤

١٥. وەرزنامەی بانەڕۆژ ، ژمارە١٦ ، کەرکووک ٢٠٠٥

١٦. گۆڤاری خوێندکاریی ژیوار(دانشگاه علوم پزشکی کردستان) ، ژمارەی٢٤

١٧. دیوانی شاعیران

دوڵبەر دڵ ئەستانای جە من ، شەرت ئی دڵستانی نیۆ
جەورش مەدەی ، ڕەنجش مەکەر ، خۆ کافرستانی نیۆ
شەرتەن بکێشۆ دڵ جەفات، با یادگار مانۆ جە لات
تۆ بۆت نە دڵ ، خۆفی خودات ، خۆ کافرستانی نیۆ
ئامام نە ڕات پێ جەستەوە ، گێرەم سڵۆم چیت نەستەوە
پی حاڵی جەستەی خەستەوە ، خۆ کافرستانی نیۆ
هەی نەونەمامی باغی دڵ، پەی تۆ سیان بەیداخی دڵ
سا مەرهەمێ پەی داخی دڵ، خۆ کافرستانی نیۆ
هەی ڕەندێ توحفێ نازەنین خاڵت جە عەنبەر، گوڵ جەمین
سا مەرهەمێ، دەر پەی برین ، خۆ کافرستانی نیۆ
بیمارو تۆم، حۆروپەری، ئەر خاهێشەن، ئەر سەرسەری
شەرتەن عەیادەتمان کەری، خۆ کافرستانی نیۆ
دادم پەنە ، چڵێو "ڕیۆن" ، قیمەتشەنە سۆنەم گیۆن
چی مامەڵە مەگنەم زیۆن ، خۆ کافرستانی نیۆ
وێڵ وێڵ مەگێڵام کۆبەکۆ ، دەردم گران بێ ڕۆ بە ڕۆ
سا حاڵو دەردیم پەرسە تۆ ، خۆ کافرستانی نیۆ
تەرکو وڵاتیت کەردەمۆ ، ژاراو و دووریت وەردەمۆ
پەرسە بە حاڵی دەردەمۆ ، خۆ کافرستانی نیۆ

سەیدی (١٧٨٤ / ١٨٥٤ ز) ، خانەگا (پاوە)

